دایکی لەسەر کورسیەکەی بەرزبووەوە و هەنگاوێکی نا. ویستی بچێتە لای کتێبخانەکە و پەپولەکە بدۆزێتەوە.
بەڵام بەرلەوەی بگاتە ئەوێ، نەنکی بانگیکرد و وتی؛
_ 'تۆنە'..
ئینجا بەدەست ئاماژەی بۆکرد کە دابنیشێتەوە.
دیسانەوە بۆ ماوەیەکی زۆر هەمووان بێدەنگبوونەوە.
سیسیلیا بەلایەوە سەیربوو کە مێشکی هێندە کراوە و تیژبوو و لەهەمان کاتیشدا هەر حەزیدەکرد بخەوێت.
بەچرپەیەک وتی؛
_ وابزانم دیسان دەخەومەوە.. لەبەرئەوە دەمەوێت بڵێم جارێ 'کاتێکی خۆش'...

کاتێک کە کەمێک دواتر خەبەری بووەوە، پەنجەرەکە کرابووەوە و کەسیش لەسەر کورسیەکەی بەردەم جێگای خەوەکەی دانەنیشتبوو.
چرکەیەک دوای ئەوە ئاریل لەپەنجەرە کراوەکەوە خۆیکرد بە ژورەکەیدا. لەسەر مێزی نوسینەکەی دانیشت. سیسیلیاش لە جێگاکەیدا هاتە دەرەوە و بەپێوە بۆی وەستا. دواتر لێی پرسی؛
_ دیسانەوە هاتیتەوە؟
ئاریل ڕاستەوخۆ وەڵامی پرسیارەکەی نەدایەوە؛
_ حەزدەکەیت پیاسەیەکی بچکۆلە بە ئاسماندا بکەین؟
سیسیلیا پێکەنی و لەوەڵامدا وتی؛
_ ئێ خۆ خۆت دەزانیت کە من ناتوانم بفرم.
ئاریل بەسەبرەوە هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشا و وتی؛
_ ئیتر کاتی ئەوە هاتووە کە واز لەو قسە قۆڕانە بهێنیت. فەرموو وەرە ئێرە.
ئینجا سیسیلیا بەرەو لای ئاریل ڕۆشت.
ئاریل دەستی گرت. چرکەی دواتر لە پەنچەرەکەوە چوونەدەرەوە و بەئاسماندا فرین، بەسەر ئەمبارەکە و هەموو ئەو ناوچەیەدا فڕین.

بەیانیەکی زووبوو، ڕێک پێش ئەوەبوو کە خۆر هەڵبێت و ڕۆژێکی تری زستان دەست پێکات.
سیسیلیا وتی؛
_ ئای کە خۆشە! لەڕادەبەدەر خۆشە!
فڕینەکەی زۆر لەوە خۆشتربوو کە مەزەنەی دەکرد. ختوکەی دەهات کە تەماشای ترۆپکی دار سنەوبەرەکانی خوارەوەی دەکرد. کە سەریشی بەرزدەکردەوە، بە هەموو ئاڕاستەیەکدا شوێنە دورەکانی دەدی. پەنجەی بۆ 'گاردەمۆون' و 'هێکسەبێرگۆسن' و 'هوردالسیون' و 'میوسە' ڕاکێشا. جگەلەوەش لەدوری دورەوە ئاودڕی ئۆسلۆی دەدی و کەمێکی دەریاشی دەهاتە بەرچاو.
لەبەرزیەکی زۆرەوە بەسەر 'ڕاونەکۆلن'دا دەفڕین. لەوێوە هەر لە کلۆ شەکرێک دەچوو.
سیسیلیا وتی؛
_ ئێستاکە ڕێک وەک داڵە گەورەکانی 'ئۆدین'ین.
ئاریل وەڵامی دایەوە؛
_ ڕاستدەکەیت. کاتێکیش کە چووینەوە سەر دەستی ڕاستی خوا، هەموو ئەو شتانەی بۆ دەگێڕینەوە کە بینیومانە.
کەمێک دواتر فڕینەوە بۆلای پەنجەرە کراوەکەوە و لەسەر قەراغی پەنجەرەکە دانیشتن، هەر ڕێک وەک ئەو کاتەی کە ئاریل بۆ یەکەمین جار هاتە لای.
هەردووکیان سەیری جێگای خەوەکەیان دەکرد. سیسیلیا بە هیچ شێوەیەک بەلایەوە سەیرنەبوو کە خۆی لەسەر جێگاکە بینی، هەروا بە قژە کاڵەکەیەوە لەسەر جێگاکە پاڵکەوتبوو. ئەستێرە کۆنەکەی دار سنەوبەرەکەشیان لەسەر لێفەکەی دانابوو.
سیسیلیا وتی؛
_ ڕاستدەکەیت.. من جوانم کە دەخەوم.
ئاریل بەتوندی دەستی گوشی. تەماشایەکی کرد و وتی؛
_ لێرەدا کە دانیشتوویت، زۆر جوانتریت.

_ بەڵام من خۆم ناتوانم ئەوەیان ببینم، چونکە ئێستاکە من لەودیوی ئاوێنەکەوەم.
لەدوای ئەو وشانەیەوە ئینجا ئاریل دەستی بەردا و وتی؛
_ هەر لە پەپولەیەکی شۆخ و شەنگ دەچیت کە لە دەستی خواوە هەڵفڕیبێت.
سیسیلیا سەیرێکی ئەملاولای ژورەکەی کرد. گورزێک تیشکی ڕوونی ئەو بەیانیە دەیدا لە مێزی نوسینەکە و عەرزەکە. هەندێ تیشکیش دەیدا لە ژێر جێگاکەی سیسیلیا و خۆیان گەیاندبووە دەفتەری یاداشتە چینیەکەی. لەبەرچاوی سیسیلیادا هەموو تاڵە ئاوریشمیەکانی دەفتەرەکە دەدرەوشانەوە و دەبریقانەوە.

**سوپاسی بێپایانی هونەرمەندی هاوڕێم "سالار مەجید" دەکەم، کە بەرگی ئەم ڕۆمانەی نەخشاند.. بەڕاستی دیسانەوە دەسترەنگی و گەورەییت سەرسامی کردمەوە... بەهرۆز حەسەن**